Kurdistan Regional Government
Ministry of Education
G.D. of Curriculum & Printings

حکومە... عێراق
بەڕێوەبە... نییەکان





# بابەتە کۆمەڵایەتییەکان

## بۆ پۆلی چوارەمی بنەڕەتی





حکو...

بەڕێو...

# بابەتە کۆمەڵایەتییەکان

بۆ پۆلی

چوارەمی بنەڕەتی

**دانانی**

**لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە**

چاپی دوازدەهەم

٢٠١٦ زایینی – ١٤٣٧کۆچی – ٢٧١٦کوردی

# جوگرافيـــا

**زانســــتێکه، لە دیاردە سروشتی و مرۆییەکانی سەر  رووی ئەم زەمینەمان دەکۆڵێتەوە وەك**
( بەرزی ونزمی رووی زەوی ، دەریا و زەریاکان ، چالاکییە مرۆییـەکان
(کشـتوکاڵ، پیشەسـازی، بازرگانی وگواستنەوە هتد .....)).




نەخشەی ژمارە ( ١ ) رووی زەوی سروشتی

## زانیاری پێویست :

گۆی زەوی لە ئاو و وشکانی پێک دێت، رووبەری ئاوییەکەی فراوانترە لە رووبەری وشکانی.
بەشی وشکانی گۆی زەوی لەچەند کیشوەرێک پێک دێت:( ئاسیا، ئەوروپا، ئەفەریقیا، ئوستراليا
ئەمەریکای باکور ، ئەمەریکای باشور ، ئەنتاریکتیکا ( جەمسەری باشور ) ).
بەشی ئاوی لە گۆی زەوی دەریا و زەریاکان دەگرێتەوە، وەک:
(زەریای مەنگ (پاسفیک) ، زەریای ئەتڵەسی ، زەریای هیندی ؛ زەریای بەستەڵەکی باکور).

# ئاڕاستەکان




بریتییە لە چوار قۆڵی زانراوی سەرەکی پێکهاتوون لە ( باكور ، باشور ، خۆرهەلات ، خۆر ئاوا) لەگەڵ ناوەندەکانیان ( باکوری خۆر هەلات ، باشوری خۆر هەلات ، باكوری خۆر ئاوا ، باشوری خۆر ئاوا )




**چالاکی**

ئایا دەتوانی وڵاتەکەی خۆت لەسەر نەخشەی ژمارە (١) بدۆزیتەوە؟

**زانیاری پێویست** :

هەرێمی کوردستان وڵاتی ئێمەیە، دەکەوێتە بەشی باکوور و باکووری خۆرهەڵاتی عێراق .

# ڕووی زەوی

## بەرزی و نزمی زەوی :

### چیا

بارستاییەکی بەرز و گەورەی زەوییە، لە ئاستی زەوییەکانی دەوروپشتیەوە بەرزترە ، لێوارەکانی لێژن، لوتکەیەك یان زیاتر لە لوتکەیەکی هەیە, بە چەند شێوەیەك دەردەکەون وەك: زنجیرە چیا و چیای تەنها کە لە ئەنجامی تەقینەوەی گڕکانەکان دروست دەبن.



وێنەی زنجیرە چیا



وێنەی تاکە چیا

**مامۆستای بەڕێز:**

(هەوڵبدە هەردوو شێوە چیاکان بە نموونە بۆ قوتابییان ڕونبکەرەوە).

# بـــــــان

ڕووبەرێکی بەرزاییە و سەری تەختانییە و بێ لوتکەیە، وەکو بانی مقان لە چەمچەماڵ و بانی تارین و سەربەن لە هەولێر، بانی کەرکوك و بانی موسڵ....هتد



وێنەی بان

# گـــــرد

لە ڕوالّەتدا لە چیا دەچێت، بەلاّم زۆر بەرز نییە، وەك چیا لێوارەکانی زۆر لێژنین، وەك کۆمەلّە گردۆلّکەکانی حەمرین ، کە سنوری هەرێمی کوردستان لە بەشەکانی ناوەراست و باشوری عێراق جیادەکاتەوە .



وێنەی گرد

# دەشت

ناوچەیەکی تەختایی و فراوانە لەسەر ڕووی زەوی، بەرزایی کەمە، وەك (دەشتی هەولێر، دەشتی شارەزوور ،دەشتی بیتوێن ، دەشتی سندی ، دەشتی حەمرین) .



وێنەی دەشت

**چالاکی:**

قوتابی خۆشەویست: تۆش هەوڵبدە ناوی چەند دەشتێکی دیکە بنووسیت .





**چالاكی:**

ناوی چەند چیایەك بنووسە لە ناوچەكەی خۆت نزیك بێت .

**زانیاری پێویست :**

دەشت زەوییەكی بەپیتە و بۆ چاندن و ئاژەڵداری و نیشتەجێبوون سوودی هەیە، زۆرترین بەرهەمی خۆراك لە دەشتەكان دەست دەكەوێت .

# دۆڵ

ناوچەیەکی نزمایی تەسکە کەوتۆتە نێوان دوو بەرزایی یا دەکەوێتە نێوان دوو شاخ.



دیمەنی دۆڵ



وێنەی گوندێکی دۆڵ

# بیابـــان

ناوچەیەکی وشکانییە، ژیانی تێدا ئاسان نییە (بۆ مرۆڤ وگیانلەبـەران)، لەرووی ئاو و هەواوە (پلەی گەرمی، شێ، با، تیشکی خۆر) رووی زەوییەکـەی بـە زۆری بە تەپۆڵە لم و زیخ داپۆشراوە.



وێنەی بیابان و تەپۆلکەلماویەکان

**چالاکی :**

دەتوانی ناوی بیابانێکمان بۆ بنووسی کە لەکوردستاندا هـەبێت؟ ئەگـەر لـە کوردسـتاندا نەبوو، نمونەیەك لـە عێراق بهێنەوە؟

**زانیاری پێویست :**

ژیانی بیابان نشینەکان جێگیرنییە هەردەم بەدوای ئاو و لەوەڕدا دەگەڕێن بـۆ بـەخێوکردنی ئاژەڵەکانیان. بە زۆری حوشتر و مەڕومالاَت بەخێو دەکەن .

**مامۆستای بەڕێز :**

هەوڵبدە لـەسەر ئەم بابەتە بە وردی پلەی گەرما و بـاو بـارانی ئـەم دەڤـەرە بـۆ قوتابییـان ڕونبکەرەوە.

# ڕووەکی خۆڕسك

ڕووەکی خۆڕسك هەموو ئەو گژو گیاو دارستانانە دەگرێتەوە کە لە خۆیانەوە دەڕوێن، بێ ئەوەی مرۆڤ دەستی لە ڕواندنیاندا هەبێت. ئاو و هەوا و خاك و بەرزی و نزمی کاریگەریان هەیە لە گەشەکردنیدا.



وێنەی دارستانی گەمەرمیی



دارستانی سنەوبەری



دارستانێکی کوردستان

**چالاکی :**

ئەگەر سەیری هەر سێ وێنەی ڕووەکی خۆڕسك بکەیت ، چ جیاوازییەك بەدی دەکەیت؟

**مامۆستای بەڕێز :**

کاریگەری ئاو و هەوا و خاك بۆ گەشەکردنی ڕووەکی خۆڕسك بۆ قوتابییان ڕوونبکەرەوە .

**ڕاهێنان :**

ناوی چەند ڕووەکێکی خۆڕسك بنووسە بە تایبەتی لە وەرزی بەهاراندا کە لە کوردستان خەڵك بۆ خۆراکی خۆیان بەکاری دەهێنن.

# گرنگی رووەکی خۆڕسك

١-ژینگە لە پیسبوون دەپارێزێت.
٢-پلەی گەرمی لە هاویندا دادەبەزێنێت.
٣-زەوی لە داماڵین و رووتانەوە دەپارێزێت.
٤-جوانی دڵڕفێن بە ژینگە دەبەخشێت.
٥-رووبەری سەوزایی فراوان دەکات.
٦-سێبەر و سابات دابین دەکات بۆ گەشت و سەیران و پشوودان.
٧-سوودی ئابووری زۆرە.
٨-سوودی پزیشکی هەیە بۆ بەرهەمهێنانی داودەرمان.



دیمەنی سروشتی رووەکی خۆڕسکی کوردستان.

**چالاکی:**

ئایا رووەکی خۆڕسك لەهەموو شوێنێك وەك یەکە ؟

**مامۆستای بەڕێز:**

**یارمەتی قوتابییان بدە بۆ دۆزینەوەی هۆیەکانی وێکنەچونی رووەکە خۆڕسکەکان.**

# سەرچاوەکانی ئاو

ئاو سەرچاوەی ژیانە، بۆ مرۆڤ و رووەك و گیانداران.





ئاو بە دوو شێوە دەردەکەوێت ، ئاوی سەرزەوی و ئاوی ژێرزەوی .

ئاوی سەرزەوی: بە شێك لەو باران و بەفرەی کە دەتوێتەوە، بەسەر رووی زەویدا دەڕوات و ئاوی سەرزەوی لێ پێکدەهێنێت .

وەك : جۆگە و رووبار و دەریاچە و گۆمەکان و زۆنگا و زەلکاو هتد........ .

# باران

بەهۆی تیشکی خۆر ئاوی دەریا و زەریاکان گەرم دادێت و دەبێت بە هەڵم، بەهۆی با لەسەر رووبەرە ئاوییەکان بۆ وشکانی دەخشێ، چونکە سووکە بەرز دەبێتەوە، کە بەرزبووە، بەرەبەرە چڕدەبێتەوە و کێشی گران دەبێت ئینجا دادەبارێتە سەر زەوی.

# بەفر

بەفریش هەر وەکو باران هەڵی ئاو لە دەریاو زەریا و رووبەرە ئاوییەکان دێت بەڵام بەهۆی دابەزینی پلەی گەرمی لەچینە بەرزەکانی ئاسمان دڵۆپە ئاوەکان و دەبەستێت و بەشێوەی کلۆی بەفر دادەبارێت .

**چالاکی :**

ئاوی سەر زەوی لەچی پێك دێت؟

**زانیاری پێویست :**

باران بارین لە هەموو جیهاندا وەك یەك نییە، ناوچە هەیە بە درێژایی ساڵ بارانی لێ دەبارێت و هەشیانە بە هاوین دەبارێت، لای خۆشمان لە کوردستان بە زستان و بە بەهار و پایزان باران دەبارێت.



وێنەی رووبار



وێنەی بەنداوی دوکان

**زانیاری پێویست :**

لە کوردستان چەند بەنداوێکمان هەیە ئاوی تێدا گلدەدرێتەوە بۆ وەرزی کەم ئاوی (هاوین) بەکاری دەهێنین و مەترسی لافاویش کەم دەکاتەوە ، وزەی کارەباشی لێ بەرهەم دەهێنرێت وەك بەنداوی دوکان و دەربەندیخان .

**بەنداو:**

رووبەرێکی فراوانی ئاوە، حکومەت دایمەزراندووە بۆ گلدانەوەی ئاوی بەفرو باران . وەکو بەنداوی دوکان و دەربەندیخان.

**راهێنان:**

سودەکانی بەنداو

١- ------------

٢- ------------

٣- ------------

٤- ------------

## چەند نموونەیکی دیاردەی ئاوی

# لافاو

هەستانی ئاوە، کە زەوی دەوروپشتی ئاوەڕۆ و رووبارەکان دادەپۆشێت، ئەمەش لە ئەنجامی باو بۆرانی زۆرەوە پەیدا دەبێت، مەترسی دەخاتە سەر ژیانی دانیشتوان.

**زانیاری:**

باوبۆرانی ناوچەکانی کەمەری زەوی سالأنە زیانی زۆر بەدانیشتوانی ئەم ناوچانە دەگەیەنێت.



وێنەی لافاو

**چالاکی :**

هەولبدە زیانەکانی لافاو دیاری بکەیت.

# تــــاڤگه

هەندێ جار ئاو لە چەم و رووبارەکان، لە شـوێنێکی بەرزەوە بـەرەو شـوێنێکی نـزم بـەخوڕ دێتەخوارەوە پێی دەوترێ (تاڤگە).



وێنەی تاڤگە

قوتابی خۆشەویست : دەتوانی ناوی چەند تاڤگەیەك بنوسی؟

**راهێنان:**

هۆی وشك بوونی تاڤگەی گەلی عەلی بەگ چییە ؟ بۆچـی نـاو بـەناو ئـەم وشـك بوونـە روودەدات؟

# ئاوی ژێرزەوی

بەشێك لە باران و ئاوی بەفری تواوە دەچێتە ناو ناخی زەوی و لە چینە نزمەکان گل دەخواتەوە، ئاوی ژێرزەوی پێك دەهێنێت، دوایی هەندێکی لە شوێنێکی نەرم و بێ هێز بەشێوەی کانی و سەرچاوە هەڵدەقوولێت. ئاوی ژێر زەوی سوودی زۆری بۆ مرۆڤ هەیە، بەکاری دەهێنین بۆ خواردنەوە و شۆرین و کشتوکاڵ و ئاودانی ئاژەڵ.



هاوینە هەواری بێخاڵ لە ڕەواندوز

**زانیاری پێویست :**

لە کوردستان لەبەر زۆری کانیاو و سەرچاوەکان، هاوینە هەواری زۆرمان هەیە، کە بۆتە جێگای سەرنجی گەشتیاران، داهاتێکی باش بۆ هاووڵاتیانی دەڤەرەکە بەدەست دەهێنێت، وەکو هاوینە هەوارەکانی ( ئەحمەداوە ، بێخاڵ و سۆلاڤ...هتد).



**چالاکی :**

بۆچی گەشتیارەکان لە هاویناندا روو لە هاوینە هەوارەکانی کوردستان دەکەن؟



# وەرزەکانی ساڵ

ساڵ چوار وەرزە ( زستان ، بەهار، هاوین ، پاییز ) لە وەرزی زستاندا بەفر و باران دەبارێت پلەی گەرمی نزم دەبێت .



وێنەی زستان

لەکاتی بەفر بارین لە ناو شارەکان منداڵان یاری بە بەفر دەکەن .

**راهێنان:**

ئایا زۆرترین بەفر بارین لە چ مانگێك دادەبارێت؟ (کانوونی دووەم ) (شوبات) ( ئادار) (کانوونی یەکەم ).

بەهۆی باران و توانەوەی بەفر ئاوی سەر زەوی و ژێرزەوی زۆر دەبێت .

# بـــەهـار

ئـاو و هـەوا فێنکـە و گـژوگیا گەشـە دەکـات، زەوی وەك رایـەخێکی سـەوزی لیـدێت، هاوولاتیان لـە شارەکان دەردەچن، ڕوو لـە سەیرانگەکان دەکەن .





وێنەی دیمەنی بەهار

# جەژنی نەورۆز

جەژنێکی کۆنی نەتەوەی کوردە، مژدەی سەرەتایی هاتنی وەرزی بەهاری پێیە، لە بەرەبەیانی ( ٢١ ) بیست و یەکی ئاداردا هاووڵاتیانی شار و لادێیەکان ئاهەنگ و خۆشی وشایی دەگێڕن، تا درەنگانێکی رۆژێ، بۆنی گوڵ و نێرگزی کوردستان هەڵدەمژن و ئێوارەش بەرەو ماڵەوە دەگەڕێنەوە.







### چالاکی :

رۆژی نەورۆز بۆ کوێ چوویت؟ چۆن ئەم رۆژەت بەسەر برد؟ هەستت بەچی کرد؟

### راهێنان

ئەم دەستە واژانە بەم وشانە تەواو بکە (سارد، باران و بەفر، فێنك، سووك )

١ – لە وەرزی زستاندا ئاو و هەوا (-----) و ------ دەبارێت ئاو زۆردەبێت.

٢- لەوەرزی بەهاردا پلەی گەرمی (----) دەبێت و دانیشتوان جلی (-----) لەبەردەکەن.

# هــــاوین

ئاو و هەوا گەرم دەبێت، باران نا بارێت، هاولاَتیان بۆ خۆ رزگارکردن لــە گــەرمای هــاوین ڕوو لـە هاوینە هەوارەکان دەکەن، یا لـە ماڵەوە هۆیەکانی فێنك کەرەوە بە کاردەهێنن.

# پـــــایز

ئاو و هەوا مامناوەندی دەبێت و بەرەو ساردی دەچێت، میوەجات پێدەگات .



وێنەی پایز

**زانیاری پێویست :**

ئاو و هەوا لـەم توخمانە پێکدێت ( پلـەی گەرمی ، بایەکان ، دابارین ، پاڵەپەستۆی هەوا).

# دانیشتوان

بۆ ئەوەی ئاشنایی جۆری نیشتەجێبوونی هاوولاَتیان ببین، پێوستمان بە زانینـی شـێوازی ژیـانی شار و لادێ و کۆچەریەکان هەیە.



وێنەی شاری کەرکووك



شەقلاوە

# شـــــار

ژمارەیەکی زۆر لە خانووبەرە و دام ودەزگە وەك ( قوتابخانە، خوێندنگە، زانکۆ ، تەلار ، ڕێگە و بان وپردی یەکتر بڕ)ی تێدایە، دانشتوانی زۆرە، بە کارو پیشەی جۆراو جۆر خەریکن.



شاری هەولێر



شاری سلێمانی



شاری دهۆك

**چالاكی :**

ناوی شارەكەی خۆت بنوسە، ئینجا وێنەیەكی جوانی بخە ناو پەڕی كتێبەكەت.

## زانیاری پێویست :

هەرێمی كوردستانی عێراق دەكەوێتە بەشی باكوور و باكووری ڕۆژهەلاتی عێراق، زۆربەی دانیشتووانی كوردن و نەتەوەی دیكەی وەك عەرەب و توركمان و كلدۆ ئاشوری لێ دەژین، لە شارە گەورەكانی وەكو ( كەركوك، هەولێر ،سلێمانی ، دهۆك ) و گەلێ شاری بچوكیشی هەیە ،لادێی زۆریشی تێدایە، بەكاری جۆراو جۆر خەریكن .




ژمارە (٢)

نەخشەی کارگێری هەرێمی کوردستانی عێراق

## ڕاهێنان

١- ناوی شارەگەورەکانی هەرێمی کوردستان بنوسە .

٢- کامە شاری کوردستان بەرکیمیابارانی رژێمی بەعسی کەوتووە؟ کە بووە هێمای خەبات و قوربانیدانی گەلی کورد؟

# لادێ و گوند

رووبەرێکی بچوکتر و خانووبەرەی کەمتری تێدا هەیە، زۆربەی دانیشتووانی بەکاری کشتوکاڵی و ئاژەڵدارییەوە خەریکن .



وێنەی جووتکردنی سەرەتای



دروێنە بەنامێر

**زانیاری پێویست :**

لە ئەنجامی سیاسەتی دڕندانەی ڕژێمە یەك لە دووایەکەکانی عێراق گەورەترین زیان بەرگوندەکان کەوتووە زیاتر لە ( ٤٥٠٠ ) گوند روخێندراوەو سوتێندراون ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانەکانیان کە بە (١٨٢٠٠٠) هەزار کەس مەزەندە دەکرێت لە زێدی باوباپیرانیان دەستگیرکران و لەبیابانەکانی خۆرئاوای عێراق زیندە بە چاڵ کران، لە ژێرناوی ( ئەنفال)، کە بە گەورەترین تاوان دادەنرێت لە مێژووی نوێ دژی گەلی کورد لە عێراق. لە دوای راپەرینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ گوندەکان بەرەبەرە ئاوەدان دەکرێنەوە.

## کۆچەر (دەوارنشین) :

ئەم کۆچەرانە ژمارەیان لە گوندنشینەکان کەمترە، خەریکی بەخێوکردنی مەڕ و ماڵاتن کوێستان و گەرمیان دەکەن بۆ پەیداکردنی ئالیکی مەڕو و ماڵاتەکانیان، ژیان لەناو ڕەشماڵ بەسەر دەبەن. بەڵام ئێستا ژمارەیان لە کەم بوون دایە بەهۆی نیشتەجێ بوونیان لە شار و گوندەکاندا.



وێنەی ڕەشماڵ

**چالاکی :**

ڕەشماڵ ماڵی کۆچەریانە (ڕەوەند ) ، لەمووی بزن دروست دەکرێت .

#ساڵنامە

**ساڵنامە چییە ؟**

نووسراوێکی سەر دیوار یان سەرمێزە ، ڕۆژ و مانگ و ساڵی تێدا دیار دەکرێت .

هەر کاتێ ویستمان زانیاری دەربارەی ڕۆژ و مانگ و ساڵ وەربگرین ، دەگەڕێینەوە بۆ ئەو خشتەیەی کە لە ناو ساڵنامەکان نەخشێنراوە .

ئەو ساڵنامانەی کە لەلای ئێمە ( هەرێمی کوردستان ) پەیرەو دەکرێت سێ جۆرن :

ساڵنامەی زایینی / ساڵنامەی کۆچی / ساڵنامەی کوردی .

ساڵنامەی زایینی / ئەو ساڵنامەیە کە دونیای سەردەم بەکاری دەهێنێت و لە هەموو ساڵنامەکانی دیکە زیاتر لە هەرێم بەکار دەهێنرێت لە دام و دەزگاکانی میری و ژیانی ڕۆژانەماندا .

**ڕاهێنان**

١- ڕۆژانە لە کاتی دەوامی قوتابخانەکەت پشت بە چ ساڵنامەیەك دەبەستیت ؟

٢- پشووی هەفتانەت لە چ ڕۆژێکە ؟

# مانگەکانی ساڵی زایینی

**1 January کانوونی دووەم**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 2 | 1 | | | | | 31 |
| 9 | 8 | 7 | 6 | 5 | 4 | 3 |
| 16 | 15 | 14 | 13 | 12 | 11 | 10 |
| 23 | 22 | 21 | 20 | 19 | 18 | 17 |
| 30 | 29 | 28 | 27 | 26 | 25 | 24 |

**2 February شوبات**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 | |
| 13 | 12 | 11 | 10 | 9 | 8 | 7 |
| 20 | 19 | 18 | 17 | 16 | 15 | 14 |
| 27 | 26 | 25 | 24 | 23 | 22 | 21 |
| | | | | | | 28 |

**3 March ئـــادار**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 | |
| 13 | 12 | 11 | 10 | 9 | 8 | 7 |
| 20 | 19 | 18 | 17 | 16 | 15 | 14 |
| 27 | 26 | 25 | 24 | 23 | 22 | 21 |
| | | | 31 | 30 | 29 | 28 |

**4 April نیســان**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 3 | 2 | 1 | | | | |
| 10 | 9 | 8 | 7 | 6 | 5 | 4 |
| 17 | 16 | 15 | 14 | 13 | 12 | 11 |
| 24 | 23 | 22 | 21 | 20 | 19 | 18 |
| | 30 | 29 | 28 | 27 | 26 | 25 |

**5 May ئایار**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | | | | | 31 | 30 |
| 8 | 7 | 6 | 5 | 4 | 3 | 2 |
| 15 | 14 | 13 | 12 | 11 | 10 | 9 |
| 22 | 21 | 20 | 19 | 18 | 17 | 16 |
| 29 | 28 | 27 | 26 | 25 | 24 | 23 |

**6 June حوزەیران**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 5 | 4 | 3 | 2 | 1 | | |
| 12 | 11 | 10 | 9 | 8 | 7 | 6 |
| 19 | 18 | 17 | 16 | 15 | 14 | 13 |
| 26 | 25 | 24 | 23 | 22 | 21 | 20 |
| | | | 30 | 29 | 28 | 27 |

**7 July تەممـــووز**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 3 | 2 | 1 | | | | |
| 10 | 9 | 8 | 7 | 6 | 5 | 4 |
| 17 | 16 | 15 | 14 | 13 | 12 | 11 |
| 24 | 23 | 22 | 21 | 20 | 19 | 18 |
| 31 | 30 | 29 | 28 | 27 | 26 | 25 |

**8 August ئـــاب**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 7 | 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 |
| 14 | 13 | 12 | 11 | 10 | 9 | 8 |
| 21 | 20 | 19 | 18 | 17 | 16 | 15 |
| 28 | 27 | 26 | 25 | 24 | 23 | 22 |
| | | | | 31 | 30 | 29 |

**9 September ئەیلول**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 4 | 3 | 2 | 1 | | | |
| 11 | 10 | 9 | 8 | 7 | 6 | 5 |
| 18 | 17 | 16 | 15 | 14 | 13 | 12 |
| 25 | 24 | 23 | 22 | 21 | 20 | 19 |
| | | 30 | 29 | 28 | 27 | 26 |

**10 October تشرینی یەکەم**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 2 | 1 | | | | | 31 |
| 9 | 8 | 7 | 6 | 5 | 4 | 3 |
| 16 | 15 | 14 | 13 | 12 | 11 | 10 |
| 23 | 22 | 21 | 20 | 19 | 18 | 17 |
| 30 | 29 | 28 | 27 | 26 | 25 | 24 |

**11 november تشرینی دووەم**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 | |
| 13 | 12 | 11 | 10 | 9 | 8 | 7 |
| 20 | 19 | 18 | 17 | 16 | 15 | 14 |
| 27 | 26 | 25 | 24 | 23 | 22 | 21 |
| | | | | 30 | 29 | 28 |

**12 December کانوونی یەکەم**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 4 | 3 | 2 | 1 | | | |
| 11 | 10 | 9 | 8 | 7 | 6 | 5 |
| 18 | 17 | 16 | 15 | 14 | 13 | 12 |
| 25 | 24 | 23 | 22 | 21 | 20 | 19 |
| | 31 | 30 | 29 | 28 | 27 | 26 |

( ساڵنامەی زایینی )

**مامۆستای بەڕێز :**

بۆ قوتابییەکانت ڕوونبکەرەوە کە ساڵنامەی زایینی لە چییەوە هاتووە .

**ڕاهێنان :**

هەفتە حەوت ڕۆژە ، شوێنە بەتاڵەکان بە ڕۆژە نادیارەکان پڕ بکەوە :

شەممە ، ........... ، ........... ، سێ شەممە ، ........... ، ............، هەینی .

# ناوی مانگەکانی ساڵی زایینی

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| کانونی دووەم | شوبات | ئادار | نیسان | ئایار | حوزیران |
| تەموز | ئاب | ئەیلول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانونی یەکەم |

## ڕاهێنان :

**وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:**

١- ئایا دەزانی هەموو ساڵێ دەرگای قوتابخانەکان لە چ مانگێك دەکرێتەوە ؟.

٢- پشووی فەرمی خوێندن لە زستان لە چ مانگێك دەست پێدەکات ؟.

٣- ڕۆژی منداڵان دەکەوێتە کام مانگ؟.

٤- ڕۆژی ژینگەی کوردستان لە چ مانگێکە؟ بۆچی ئەم ڕۆژەیان دیاری کردووە؟.

## ڕۆژی شەهیدانی زانکۆ:

بۆ ڕێزلێنان لەقوربانیان بۆردمانی زانکۆی سلێمانی لە قەڵادزێ ساڵی ١٩٧٤ لەلایەن ڕژێمی بەعسی لەناوچوو.

(٢٤) نیسانی هەموو ساڵێك کرا بەڕۆژی شەهیدانی زانکۆ لە هەرێمی کوردستان.

لەم ڕۆژە فڕۆکەکانی ڕژێم بە بۆمبی ناپاڵمی قەدەغەکراوی نێو دەوڵەتی قەڵادزێیان بۆردمان کرد، قوربانیانی ئەم بۆردمانە دڕندانەیە (١٦٣) خوێندکارو قوتابی و ژن ومنداڵ و پیر شەهید بوون، پتر لە (٢٥٠) هاوڵاتیش بریندار بوون و شارەکەش وێرانکرا.



وێنەی قوتابخانە



مامۆستا ئامۆژگاری قوتابییەکان دەکات

**زانیاری :**

١- سەرەتای دەستپێکردنی ساڵنامەی زاینی بە لە دایکبوونی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خودای لێبێت) دەست پێدەکات و دەکرێتە دوانزە مانگ ، ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵی زاینی ٣٦٥ ڕۆژ و چارەکە ڕۆژێك، بەهەر چوار ساڵ جارێك دەبێتە ٣٦٦ ڕۆژ ، پێی دەوترێت ساڵی کەبیسە.

٢-لە بەهاری ساڵی ١٩٩١ گەلی کوردستان دژ بە ڕژێمی عێراق ڕاپەڕی ، لە ئەنجامدا زۆربەی ناوچەکانی کوردستان لە دەستی ستەم و زۆرداری ڕژێمی دڕندە ڕزگارکران.

## ساڵنامەی کوردی

ئەم ساڵنامەیە تایبەتە بە مێژووی گەلەکەمان لە کوردستان . سەرهەڵدانی ئەم ساڵنامەیە دەگەڕێتەوە بۆ ( ٧٠٠ ساڵ پێش زایین ) کە مێژووی دامەزراندنی دەوڵەتی مادی کوردییە( میدیا ). بۆتە سەرەتای ساڵنامەی کوردی .

**زانیاری :**

مادەکان باپیرانی گەلی کوردن زیاتر لە ٥٠٠٠ پێنج هەزار ساڵ پێش زایین ، لەم ناوچەیە ژیاون و شارستانیەت و دەوڵەتیان دامەزراندوە،پایتەختەکیان شاری ئەکباتانا(هەمەدان) بووە. لە ساڵی ٥٥٠ پێش زایینی دەوڵەتەکەیان بە دەستی پاشای ئەخمینیەکان (کورش) لە ناوچووە .



نموونەیەك لە شارستانییەتی مادەکان

**مامۆستای بەڕێز :**

ئەم زانیارییانە بۆ قوتابییەکانت شیبکەوە .

بۆ زانینی ساڵنامەی کوردی ٧٠٠ ساڵ + ٢٠١١ ساڵی زاینی = ٢٧١١ ساڵی کوردی.

**زانیاری :**

ڕۆژی یەکەمی ساڵی کوردی لە ٢١ ئاداری هەموو ساڵێك دەست پێدەکات ، کە دەکاتە یەکەم ڕۆژی نەورۆز ، مژدەی خۆشی بەهار لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت وکۆتایی بە سەرما و سۆڵی زستان دەهێنێت.



# مانگەکانی ساڵی کوردی

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| خاکه لێوه (نەورۆز) | گوڵان | جۆزەردان | پوشپەر | خەرمانان | گەلاوێژ |
| رەزبەر | گەلاڕێزان | سەرماوەرز | بەفرانبار | رێبەندان | رەشەمێ |

**چالاکی :**

خانە بەتاڵەکان بە ناوی مانگەکان پڕبکەوە :-

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| خاکه لێوه (نەورۆز) | | | پوشپەر | | |
| | | | بەفرانبار | | رەشەمێ |



# مانگەکانی ساڵی کوردی

**نەورۆز (خاکەلێوە)** 2709

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 7 | 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 |
| 14 | 13 | 12 | 11 | 10 | 9 | 8 |
| 21 | 20 | 19 | 18 | 17 | 16 | 15 |
| 28 | 27 | 26 | 25 | 24 | 23 | 22 |
| | | | | 31 | 30 | 29 |

**گوڵان (بانەمەڕ)** 2709

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 4 | 3 | 2 | 1 | | | |
| 11 | 10 | 9 | 8 | 7 | 6 | 5 |
| 18 | 17 | 16 | 15 | 14 | 13 | 12 |
| 25 | 24 | 23 | 22 | 21 | 20 | 19 |
| | 31 | 30 | 29 | 28 | 27 | 26 |

**جۆزەردان** 2709

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | | | | | 31 | 30 |
| 8 | 7 | 6 | 5 | 4 | 3 | 2 |
| 15 | 14 | 13 | 12 | 11 | 10 | 9 |
| 22 | 21 | 20 | 19 | 18 | 17 | 16 |
| 29 | 28 | 27 | 26 | 25 | 24 | 23 |

**پوشپەڕ** 2709

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 5 | 4 | 3 | 2 | 1 | | |
| 12 | 11 | 10 | 9 | 8 | 7 | 6 |
| 19 | 18 | 17 | 16 | 15 | 14 | 13 |
| 26 | 25 | 24 | 23 | 22 | 21 | 20 |
| | | 31 | 30 | 29 | 28 | 27 |

**خەرمانان** 2709

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 2 | 1 | | | | | 31 |
| 9 | 8 | 7 | 6 | 5 | 4 | 3 |
| 16 | 15 | 14 | 13 | 12 | 11 | 10 |
| 23 | 22 | 21 | 20 | 19 | 18 | 17 |
| 30 | 29 | 28 | 27 | 26 | 25 | 24 |

**گەلاوێژ** 2709

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 | |
| 13 | 12 | 11 | 10 | 9 | 8 | 7 |
| 20 | 19 | 18 | 17 | 16 | 15 | 14 |
| 27 | 26 | 25 | 24 | 23 | 22 | 21 |
| | | | 31 | 30 | 29 | 28 |

**ڕەزبەر** 2709

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 3 | 2 | 1 | | | | |
| 10 | 9 | 8 | 7 | 6 | 5 | 4 |
| 17 | 16 | 15 | 14 | 13 | 12 | 11 |
| 24 | 23 | 22 | 21 | 20 | 19 | 18 |
| | 30 | 29 | 28 | 27 | 26 | 25 |

**گەلاریزان (خەزەڵوەر)** 2709

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 7 | 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 |
| 14 | 13 | 12 | 11 | 10 | 9 | 8 |
| 21 | 20 | 19 | 18 | 17 | 16 | 15 |
| 28 | 27 | 26 | 25 | 24 | 23 | 22 |
| | | | | | 30 | 29 |

**سەرماوەز** 2709

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 5 | 4 | 3 | 2 | 1 | | |
| 12 | 11 | 10 | 9 | 8 | 7 | 6 |
| 19 | 18 | 17 | 16 | 15 | 14 | 13 |
| 26 | 25 | 24 | 23 | 22 | 21 | 20 |
| | | | 30 | 29 | 28 | 27 |

**بەفرانبار** 2709

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 3 | 2 | 1 | | | | |
| 10 | 9 | 8 | 7 | 6 | 5 | 4 |
| 17 | 16 | 15 | 14 | 13 | 12 | 11 |
| 24 | 23 | 22 | 21 | 20 | 19 | 18 |
| | 30 | 29 | 28 | 27 | 26 | 25 |

**ڕێبەندان** 2709

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | | | | | | 30 |
| 8 | 7 | 6 | 5 | 4 | 3 | 2 |
| 15 | 14 | 13 | 12 | 11 | 10 | 9 |
| 22 | 21 | 20 | 19 | 18 | 17 | 16 |
| 29 | 28 | 27 | 26 | 25 | 24 | 23 |

**ڕەشەمێ** 2709

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 | |
| 13 | 12 | 11 | 10 | 9 | 8 | 7 |
| 20 | 19 | 18 | 17 | 16 | 15 | 14 |
| 27 | 26 | 25 | 24 | 23 | 22 | 21 |
| | | | | 30 | 29 | 28 |

سالنامەی کوردی

**چالاکی :**

خۆشترین، یان ناخۆشترین ڕۆژ لە نێو مانگە کوردییەکان ، بۆیان گێڕابیتەوە یاخۆت دیتبێت و کاری تێکردبێت، دیاری بکە و بۆ هاوڕێکانتی بگێڕەوە .



وێنەی کۆڕەوی ١٩٩١

**ڕاهێنان :**

ڕۆژی کۆڕەوە مەزنەکەی گەلی کورد لە ئاداری ١٩٩١، دانیشتوانی کوردستان بە تێکڕا ماڵ و سامانی خۆیان جێهێشت و بەرەو چارەنوسێکی نادیار بەڕێکەوتن تەنها بۆ ئەوەی سەر بۆ ڕژێمێکی دڕندە شۆڕ نەکەن.

ئایا ئەنجامی ئەم کۆڕەوە مەزنە بۆ گەلی کوردستان چی بوو؟.

**زانیاری :**

١٤ نیسانی ١٩٨٨ چوار شارۆچکەی گەرمیان لە یەك ڕۆژدا بە تەواوەتی وێران کران و نزیکەی بیست هەزار ژن و منداڵ و پیاوی کورد ڕەوانەی سەربازگەکانی لەناوبردن کران. بۆیە لەبەر گەورەیی تاوانەکە و زۆری زیانەکانی ئەم ڕۆژە کراوەتە ڕۆژی یادکردنەوەی تاوانە گەورەکەی ئەنفال لە کوردستان.

# ساڵنامەی کۆچی

ئەم ساڵنامەیە ( ساڵنامەیەکی ئیسلامییە ، لەو ڕۆژەوە دەست پێدەکات کە ( محمد ) پێغەمبەر( د.خ ) لە مەککەوە بۆ مەدینە ( یثرب ) کۆچی کرد ، بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام و خۆ ڕزگار کردن لە دەست ستەم و زۆرداری قورەیشیەکان لە شاری مەککە . ئەو ڕۆژە لە سەردەمی خەلیفە ( عومەری کوری خەتاب ) ( ر.خ ) پەیڕەو کرا.



وێنەی شاری مەککە

**مانگەکانی ساڵی کۆچی :**

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| موحەرەم | سەفەر | رەبیعی یەکەم | رەبیعی دووەم | جەمادی یەکەم | جەمادی دووەم |
| رەجەب | شەعبان | رەمەزان | شەوال | ذولقەعدە | ذو لحەجە |

**ڕاهێنان :**

١- یەکەم ڕۆژی ڕۆژو گرتن دەکەوێتە کام مانگ ؟

٢- چەند یاد و جەژنێکی ئاینی دیاری بکە ؟




ساڵنامەی کۆچی

**چالاکی :**

ناوی چوار مانگی ساڵی کۆچی لە خانە بۆشەکان بنوسە :

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| موحەرەم | سەفەر | | رەبیعی دووەم | جەمادی یەکەم | |
| | | رەمەزان | شەوال | ذولقەعدە | ذو لحەجە |

# شارە دێرینەکانی هەرێمی کوردستان

کوردستان وڵاتێکی دێرینە ، چەندان شاری کۆن و مێژوویی گرتۆتە خۆ .

## هەولێر

شارێکی دێرینی کوردستانە کەوتۆتە پێدەشتێکی فراوان بۆ یەکەم جار لە مێژوو ناوی ئەم شارە لە نوسینەکانی پاشایەکی سۆمەری لە ساڵی (٢٠٠٠)دوو هەزار پێش زاین بە ناوی ئوربیلم هاتووە. دەرکەوتنی شارستانیەتی ئەم شارە دەگەڕێتەوە بۆ(٦٠٠٠) شەش هەزار ساڵ پێش زایین. هەولێر گەلێ ڕووداوی گەورەی بەخۆوە دیوەوە و گەلێ ناوداری تێدا هەڵکەوتووە، کە خزمەتی شارستانیەت و مرۆڤایەتییان کردوە، ئێستاش پایتەختی هەرێمی کوردستانە .



قەڵای هەولێر

**زانیاری :**

لە ساڵی ( ٣٣١ ) سێسەدوسیویەك پێش زایین (پ.ز) پاشای مەکدۆنییەکان (ئەسکەندەری گەورە) بەسەر (داریۆشی سێیەم) پاشای ئەخمینیەکان لە نزیك هەولێر لە شەڕی ( گۆگامیلا ) (ئەربیلا)سەرکەوت .



وێنەی منارەی موزەفەریە ( چۆلی ) لە شاری هەولێر

# کەرکوك

شارێکی دێرینی کوردستانە لەسەر قەڵایەك بنیادنراوە ، لە مێژووی کۆن بە ناوی (ئارابخا) ناسراوە ئەم ناوەش بۆ یەکەمین جار لەسەردەمی پاشای بابلی حامورابی ناوی هاتووە ماوەیەکی زۆر پایتەختی گوتییەکان بووە .



وێنەی قەلاّی کەرکوك

**زانیاری :**

کەرکوك لە کۆن و ئێستا بایەخێکی زۆری هەبووە و هەیە چونکە هەمیشە مەڵبەندێکی ئاوەدانی گرنگ بووە، بۆیە بەر لێشاوی رژێمە دڕندەکانی پێشووکەوتووە و دانیشتوانەکەی کە زۆربەی کوردن, وەبەر دەرکردن و گواستنەوە و بەعەرەبکردن و ئەنفالکردن کەوتوون .

**چالاکی :**

مامۆستای بەڕێز :

دەکرێت چالاکییەك بە قوتابییان ئامادە بکەیت لە بارەی ئەمڕۆی کەرکوك .

**زانیاری :**

کەرکوك بە سامانی نەوت دەوڵەمەندە .

# سلێمانی

پایتەختی میرنیشینی بابانەکان بووە . یەکێکە لە شارە گەورەکانی کوردستان و مەڵبەندێکی ڕۆشنبیری و کارگێڕی گرنگە .

گەلێک شاعیر و کەڵە مێردی ناوداری کوردی تێدا هەڵکەوتووە .



وێنەی شاری سلێمانی

**زانیاری :**

شاری سلێمانی لە ساڵی( ١٧٨٤ )هەزار و حەوسەد و هەشتاو چواری زاینی لەلایەن ( ئیبراهیم پاشای بابان) بنیادنراوە ،پایتەختی حکومەت بووە لە سەردەمی ( مەلیك محمود ) لە سەرەتای سەدەی بیستەم.

**ڕاهێنان :**

١- شاری سلێمانی لە دوای کوێ بووە بە پایتەختی میرنیشینی بابان ؟

٢- ناوی چەند ناودار و شاعیرێکی شاری سلێمانی بۆ هاورێکانت ڕوونبکەوە ؟

# ئامێدی

یەکێکە لە شارە دێرینەکانی کوردستان کەوتۆتە سەر بانێکی بەرز ، ماوەیەکی زۆر قەلاّو پایتەختی میرنشینی بادینان بووە .







وێنەی شاری ئامێدی

**زانیاری** :

شاری ئامێدی پاشماوەی چەندین شوێنەواری مێژووی کۆنی تێدا ماوە : وەك دەروازەی شار و مزگەوت و خوێندنگە ئایینیەکان .

# هەڵەبجە

دەکەوێتە مەڵبەندی دەشتی شارەزوور . لە ( ١٦ /٣/١٩٨٨ ) کەوتە بەر هێرشی کیمیابارانی رژێمی بەعس ، زیاتر لە ( ٥٠٠٠ ) پێنج هەزار قوربانی و پازدە هەزار بریندار لێکەوتەوە و شارەکەش خاپوور و وێرانکرا .



وێنەی شاری هەڵەبجە لەکاتی کیمیا باراندا

**زانیاری :**
وەك ڕێزلێنان بۆ گیانی قوربانیانی کیمبابارانی لەلایەن رژێمی بەعس سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان لە حوزەیرانی ٢٠١٣ بڕیاری بەپارێزگاکردنی شاری هەڵەبجەی دەرکرد .

**ڕاهێنان :**
کاریگەری کیمیابارانی شاری هەڵەبجە چ پاشماوەیەکی خراپی لە دوای خۆی بەجێهێشتوە ؟ ئەمە بکە دارشتن و لەگەڵ هاوڕێکانت گفتوگۆی لەسەر بکە .

**زانیاری :**
ڕەشە کوژی کورد لە لایەن بەعس و بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی یەکێك بوو لە کارە هەرە نامرۆییەکانی، ئەم ڕژێمە و بۆتە پەڵەیەکی ڕەش لە نێوچەوانی داگیرکەرانی کوردستان. کە هەتا هەتایە مێژوو پێەوەی شەرمەزارە.

# ڕەواندوز

قەلاّو پایتەختی میرینشینی سۆران بووە بە تایبەتی لە سەردەمی ( میر محەمەدی پاشای گەورە ). تووشی گەلێ کارەساتی گەورە هاتووە . وەك هێرشی سوپای رووس و عوسمانییەکان بۆ سەر دەڤەرەکەیان ، ڕێگایەکی سەرەکی کاروانچییان بووە ، کە هەمیشە بۆتە مایەی خێروخۆشی بۆ ئەم دەڤەرە .



تۆپەکەی وەستا ڕەجەب ( ڕەواندوز )



وێنەی خەرەندی ( ڕەواندوز )

**زانیاری :**

ڕەواندوز شوێنێکی بەرز و سەختە ، دوژمن بە ئاسانی نەیتوانیوە داگیری بکات .بۆیە کراوە بە پایتەختی میرنیشینی سۆران .

# زاخـــــــۆ



بازێری زاخۆ

شارێکی ناودار و مێژوویی دەڤەری بادینان و مەڵبەندێکی بازرگانی گرنگ بووە . دەروازەی سەرەکی رێگەی لە شکرکێشی هێزە جیاجیاکان بووە لە قۆناغە مێژووییەکان .



پردی دەلال لە زاخۆ

**زانیاری :**

لە شوێنە مێژوویەکانی زاخۆ کە تا ئێستاش مابێت و بەرچاو بێت پردی دەلالە لە زاخۆ .

**چالاکی :**

شاری زاخۆ دەروازەیەکی گرینگی بازرگانی هەرێمی کوردستانە لەگەڵ وڵاتی تورکیا و پردی پەیوەندی نێوان هەرێم و ئەورووپایە.

# شوێنەوارە دێرینەکانی کوردستان

## ئەشکەوتی شانەدەر

یەکێکە لە ئەشکەوتە دێرینەکانی کوردستان ، دەکەوێتە چیای برادۆست لە پارێزگای هەولێر. مرۆڤ لــــە قۆناغەکانی پێش مێژوو لەم ئەشکەوتە ژیاون ، کە بە مرۆڤی ( نیاندرتاڵ ) ناسراوون.



ئەشکەوتی شانەدەر



مرۆڤی نیاندرتاڵ

**ڕاهێنان :**

مرۆڤ لە چ سەردەمێك لە ناو ئەشکەوتەکان ژیاون ؟

# ئەشکەوتی هەزار مێرد

دەکەوێتە چیای (بەرانان) لە دووری ( ١٣ ) سێزدە کیلۆمەتر لە باشووری خۆرئاوایی شاری سلێمانی . مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی کۆن کە مرۆڤی کۆنی تێدا ژیاوە .







ئەشکەوتی هەزار مێرد لە سلێمانی

# گوندی چەرمۆ

گوندی چەرمۆ دەکەوێتە سەر گردۆڵکەیەک بە بەرزی ٢٣م لە خۆرهەڵاتی شاری چەمچەماڵ لە پارێزگای کەرکوک،
لە مەڵبەندە سەرەکییەکانی نیشتەجێی مرۆڤ دادەنرێت لەدوای ژیانی ناو ئەشکەوت، لەم گوندە بۆ یەکەم جار لە مێژووی مرۆڤایەتی کشتوکاڵیان کردووە و ئاژەڵیان بەخێوکردووە، شوێنەواری مرۆڤ و ژیانی تێدایە. تەور و داس و شەنە و (دەستاڕیان بۆ هاڕینی دانەوێڵە بەکارهێناوە)، دە چینی یەکەمی ژێرەوەی گردەکە، مەزەندە دەکرێت بۆ سەردەمی چاخی بەردینی کۆن بگەڕێتەوە، ژنان خشلی لە قوڕ دروستکراو و بازنی مەرمەڕیان بەکارهێناوە بۆ خۆڕازاندنەوە، مردووەکانیشیان لەژێر خانووەکانیان ناشتووە. مێژووی گوندی چەرمۆ بۆ ٦٥٠٠ ساڵ پێش زاین دەگەڕێتەوە.



چەمچەماڵ



شوێنەواری چەرمۆ

**ڕاهێنان :**

**مرۆڤ یەکەم جار لە کوردستان لە کوێ نیشتەجێ بووە و ئاوەدانی دروستکردووە ؟**

**چالاکی :**

مامۆستای بەڕێز : کورتەیەک لەسەر گوندی (چەرمۆ) و دەقەرەکە بۆ قوتابییەکانت ڕوونبکەوە .

# مۆزەخانە



مۆزەخانەی هەولێر

شوێنی هەڵگرتن و پاراستنی ئاسەواری دێرینی گەلانی ئەم سەر زەمینەیە . بە هۆی مۆزەخانەوە مێژووی گەلان وون نابێت . لە بە ناوبانگترین مۆزەخانەکانی جیهان ئەمانەن:
( مۆزەخانەی لەندەن ، لۆڤەر ، بەرلین ، میسر ، بەغدا )

**چالاکی :**
دەکرێ مامۆستا یارمەتی قوتابییەکانی بدات بۆ سەردانی مۆزەخانەی شارەکەی ئەگەر هەبێت ، یا لەرێگەی وێنەی جۆراوجۆر و هۆیەکانی فێرکردن شوێنەواری کوردستان بناسێت.

# مۆزەخانەی هەولێر

مۆزەخانەی هەولێر دەکەوێتە شوێنەواری دێرینی ( گردی قالیچ ئاغا ) لە ناو شاری هەولێر. چەندین پەیکەر و پاشماوەی مێژوویی ئەم دەڤەرەی تێدا پارێزراوە و ڕۆژانە هاووڵاتیان سەردانی دەکەن.



مۆزەخانە

# مۆزەخانەی سلێمانی

لە شاری سلێمانی مۆزەخانەیەك هەیە ، پاشماوە و کەرەستەی کۆنی ئەم ناوچەیەی تێدا پارێزراوە . کە بۆتە گەنجینەیەك بۆ مێژووی گەلەکەمان .




مۆزەخانەی سلێمانی

# خێزان

**خێزان :-** پێکهاتووە لە چەند کەسێك کە پێکەوە لە ماڵێکدا دەژین ، پەیوەندی کۆمەلأیەتی وخزمایەتی پێکەوەیان دەبەستێتەوە .



وێنەی خێزانێك

**دووجۆر خێزان هەیە /**

**خێزانـــــــــــی بچووك** : -لە دایك وباوك خوشك و برا پێکهاتووە .

**خێزانـــــــــــی گەورە** :- لەداپیرە و باپیرە ، دایك و باوك ، مام و پور و منداڵەکان پێکهاتووە، کە ژمارەی ئەندامانیان لە خێزانی بچووك زۆرترە، پەیوەندی کۆمەلأیەتی و خزمایەتی پێکەوە کۆیان دەکاتەوە .

**ڕاهێنان** :

خێزانەکەی ئێوە لەکامە جۆرە ؟..........................................

ژمارەی ئەندامانی خێزانەکەت چەند کەسن ؟....................................

کێن ئەوانەی خێزانەکەی تۆ پێکدێنن ؟......................................

## دایــــك

ڕۆژانە خەریکی خزمەت وکاری ماڵە ، چێشت لێ دەنێ وخواردن دروست دەکات ، جل دەشوات و ماڵ بۆ ئەندامانی خێزانەکەی پاك دەکاتەوە . هەندێك لەدایکان سەرەڕای کاری ماڵەوە ، لەدەرەوەی ماڵیش وەك فەرمانبەر، مامۆستا ، پزیشك یا ئەندازیار ....هتد کاردەکەن . ئەرکێکی یەکجار پیرۆز و گەورەیان لە ئەستۆ دایە ، چونکە پەروەردەی منداڵەکانیش دەکەن .

بۆیە پێویستە ڕێزی زۆری لێبگیرێت ، ڕۆژانە یارمەتی بدەین ، بۆئەوەی کەمێ لەماندووبوونەکەی کەمبکەینەوە ، بێزاریان نەکەین ، چونکە دایك مافی زۆری بە سەرمناڵەکانی هەیە .

لەکاتی پیربوون و پەککەوتن پاداشتی بدەینەوە ، هەمیشە ئەرك وماندوبوونەکەی لەبیر نەکەین.

## بــاوك

بە ئیش وکارو فرمانی دەرەوە خەریکە ، پێداویستییەکانی ژیان بۆ خێزانەکەی دابین دەکات ، چ بەکاری ئازاد یا فەرمانبەری ، بۆیە پێویستە یارمەتی بدەین و دڵی خۆشبکەین باوك سەرەڕای سەرقاڵبوونی بەکاری دەرەوە و پەیداکردنی بژێوی ڕۆژانە بۆ خێزانەکەی ، ئامۆژگاری منداڵەکانی و ڕێنمایی خێزانەکەی دەکات ، فێری خۆشەویستی نیشتمان و ڕاستگۆی و دەستپاکییان دەکات ، تاوەکو لەدوارۆژدا ببنە کەسێکی بەوەفا و دڵسۆز بۆ وڵاتەکەیان و ئەندامێکی بەسود بن لە ناو کۆمەڵدا .

## کــچ

دوای تەواوکردنی ئەرکی قوتابخانە یارمەتی دایکیان دەدەن لەکارەکانی ماڵەوە .

## کوڕ

دوای پشوودان و جێبەجێکردنی ئەرکی قوتابخانە یارمەتی باوکی دەدات.

## داپیر ( نەنك )

ڕۆژانە چاودێری منداڵە بچووکەکان دەکات و یارمەتی دایکی منداڵەکان دەدات بۆ هێمنکردنەوەی منداڵەکان . ئێوارانیش بەسەرهات و چیرۆکی خۆشیان بۆ دەگێڕێتەوە تاخەوتنان.

## باپیر

بە تەمەن داچووە وخۆشی وناخۆشی زۆری دیتووە ، شارەزایی زۆری لە ژیاندا پەیداکردوە ، بۆیە ئامۆژگاری هەموویان دەکات و ڕێنماییان دەدات ، تاوەکو تووشی هەڵە نەبن ، هەمیشە فێری ڕاستگۆیی و دەستپاکی و یارمەتیدان و کۆمەکی هەژاران و لێقەوماوان و خۆشەویستی دەوروپشت و نیشتمانیان دەکات .

**چالاکــــی:**

خێزان لە دایك و.........،.........، ........... ، ............... ، ........... پێکدێت

**ڕاهێنان**

نیشانەی ( √ ) یان ( × ) بەرامبەر بەم ڕستانە دابنێ و هەڵەکان ڕاستبکەوە .

١. ئەندامانی خێزان دەبێت تەبابن . (        ) .

٢. ئەرکی دایك پیرۆزە . (        ) .

٣. گەورە یارمەتی بچووك نادات . (        ).

٤. باپیرە وتی : لەناو خێزان پشت بەیەك ببەستن (        ) .

## راهێنان

**لە هەردوو بڕگەی ( أ , ب ) وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە و ڕستەکان ڕێك بخە :**

| ب | أ |
|---|---|
| ١- بەرەوبازاڕ دەکەوێتە ڕێ و یارمەتی باوکی دەدات . | ١- هەموو ئێوارەیەك داپیرە |
| ٢- یارمەتی دایکی دەدا و لەکاروباری ماڵەوە هاوکاری دەکرد . | ٢- سۆران دوای نان خواردن و حەسانەوە |
| ٣- ڕێنمایی و ئامۆژگاری منداڵەکانی لە بیر نەدەکرد . | ٣- ئامێز دوای گەڕانەوەی لە قوتابخانە |
| ٤- چیرۆکێکی خۆشی بۆ منداڵەکان دەگێڕایەوە . | ٤- سەرەڕای سەرقاڵبوونی باوکیان بەکاری گوڵفرۆشی |



باپیرە و نەوەکانی

# دراوسێیەتی باش

ئەو ماڵانەی کەوتوونەتە دەوروپشتی ماڵەکەمان لە نێو کۆڵان و گەڕەکەکەمان پێیان دەوترێ دراوسێ . ئەوکەسانەی لەناو ئەو ماڵانە دەژین ، مافی زۆریان بەسەرمانەوە هەیە ،پێویستە ڕێزیان لێبگیرێت ، ئاگاداری خانوو وباخچە و ناوماڵ و کەل وپەلەکانیان بین ، لە کەسانی دز و خراپ بیانپارێزین ، وابکەین دراوسێکانمان هەردەم هەست بەخۆشی و پشوو و حەسانەوە بکەن . نەهێڵین دڵتەنگ و بێزاربن ، کاتی چوونەدەرەوەیان لە ماڵ و سامانیان دڵنیابن . دەنگ بەرزنەکەینەوە لەکاتی یاریکردن ، بەدەنگی رادیۆ و تەلەفزیۆن و بڵندگۆ سەریان نەیەشێنین . بەبێ پرس هەڵنەکوتینە سەرماڵی دراوسێکانمان ، بەشداری خۆشی وناخۆشیان بکەین . برا و خوشکە بچوکەکانمان ئامۆژگاری بکەین تێیانبگەیەنین ئەو دراوسێیانە خۆشەویست و هاوسێی ئێمەن ، چیمان بۆخۆمان ویست و پێمان خۆشبوو دەبێت بۆ ئەوانیشمان بووێت .

**چالاکی :**

مامۆستای بەڕێز / داوا لە قوتابییەکانت بکە گفتوگۆ لە بارەی دراوسێکانیان بکەن.

## ڕاهێنـــــان

نیشانەی ( √ ) بۆ ڕەوشتی چاك ، نیشانەی ( × ) بۆ ڕەوشتی خراپ دابنێ :

| خووڕەوشت | | خووڕەوشت | |
|---|---|---|---|
| ڕێز لەگەورە دەگرم. | | یارمەتی پەککەوتە نادەم. | |
| پاش نانخواردن دەستەکانم ناشۆم. | | لەسەر شەقام یاری دەکەم . | |
| ئەرکەکانی خۆم جێبەجێ دەکەم. | | ئاسوودەیی دراوسێ دەپارێزم. | |
| حەزم لە خاوێنییە. | | بەبێ لەدەرگە دان ناچمە ماڵی دراوسێ. | |

# پاراستنی پاکو خاوێنی ژینگەی قوتابخانە



بۆ پاراستنی پاکو خاوێنی پۆلەکەم گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی مامۆستاکەم دەبم. پاشماوەی خۆراك و تاشراوی قەڵەمەکەم و کەلوپەلی بێسوود هەمیشە دەخەمە ناو شوێنی تایبەتی کە بۆ زبڵ و خاشاك ئامادەکراوە ، فڕێی نادەمە سەر زەوی قوتابخانەکەم.

دیوار وکەل وپەلی پۆلەکان پیس نەکەین و نایانشکێنین . پارێزگاری لە ژینگەی قوتابخانەکەمان دەکەین.

ئامۆژگاری هاوڕێکانمان دەکەین کەهەمیشە ژووری پۆلەکان و گۆڕەپانی قوتابخانەکەمان و کۆڵان و شەقامەکانمان بە پاکی رابگرین ، هەرچیەکی ناشیرین و ناشیاومان بینی ئەگەر لە توانامان هەبێت لایدەدەین و دەیخەینە شوێنی تایبەت بۆکۆکردنەوە و فڕێدان . پۆلی پاك نیشانەی پاکی قوتابی و بەرزی رەوشتیەتی . ژینگەی پاك و پارێزراو رەنگدانەوەی رەوشت و پەروەردەی پاکی قوتابییە .

**چالاکی :**

مامۆستای بەڕێز : دوو دەستە لە قوتابییان پێك بێنە بۆ ئەنجامدانی ئەم چالاکییە : ( وەلاّم وگفتوگۆ )

١. قوتابی بەڕێز چوار هۆ بژمێرە کە ژینگەکەت پیسدەکات .

٢. پیسی ژینگە لە سێ رووەوە کارمان لێ دەکات وەك پیسبوونی ( هەوا ، ئاو ، خاك ).



**چالاکـــــــــی :**

چی بکەین باشە بۆ پاراستنی ژینگە ؟

مامۆستای بەڕێز پرسیار لە قوتابییەکان بکە کەچۆن ژینگەی قوتابخانەکەیان دەپارێزن



## یارمەتیدانی پیر و پەککەوتە و خاوەن پێداویستە تایبەتییەکان

مرۆڤ کەتەمەنی گەورەدەبێت ، توانای کارکردنی کەمدەبێت و پیردەبێت.
هەموو مرۆڤێك رۆژێك لە رۆژان بەتوانا بووە ، کەسانێکی زۆری پەروەردە کردووە ، بەلاّم کە تەمەنی بەسەرچوو لەسەر ئەم شەنگ و توانایەی نامێنێت و پێویستی بەیارمەتی و دلّنەوای هەیە .
ئێمەی مندالاّن کە کوڕ و کچ و نەوەی ئەوانین نابێ دلّیان بشکێنین و هەلّسوکەوتی ناشیرینیان بەرامبەربکەین ، دەبێ ریّزیان لیبگیرێت و داوکارییەکانیان جێبەجێبکەین ، هەرچیان ویست زوو بێ دواخستن بۆیان ئامادە بکەین ،ئەمە کارێکی مرۆڤانەیە لەلایەك ، لەلایەکی دیکە ئێمەش دوای چەند سالأنێکی تر وەك ئەوان پێویستیمان بەیارمەتیدان و هاوکاری دەبێت.
پەککەوتەش وەك نابینا ، بێدەست و قاچ یا هەرئەندامێکی دیکە جەستەی لە دەستدابێت ، مافیان لەسەرمانە وەك مرۆڤ دەبێ یارمەتیان بدەین .
کاتێ نابینایەکمان بینی دەیەوێ لەشەقام بپەڕێتەوە ، دەبێ زوو بگەینە لای و دەستی بگرین و لە شەقام بیپەڕێنینەوە.

**قوتابی خۆشەویست** :-
ئەگەر جارێك کارێکت کردبێت یارمەتی پەککەوتەیەك یا نابینایەکت دابێت ، بۆهاورێکانت بگێڕەوە ، تاوەکو ئەوانیش چاو لەتۆ بکەن.

**مامۆستای بەڕێز** : -
زۆر لە خاوەن پێداویستیە تایبەتییەکان، رۆلّی گەورەیان لە ژیانی مرۆڤایەتی گێڕاوە ، قوتابییەکانت بە ناوی چەند لەو بلیمەتانە ئاشنا بکە.

**چالاکـــــــــی** :-
پەککەوتەیـــــــــــی نەنگی نییە .....جوانی مرۆڤ لە مێشك و هەلّسوکەوتی دایە.

# خووڕەوشتی جوان

ڕێزگرتن لە مامۆستاو جێبەجێکردنی ئەرکەکانی خوێندن ، پاریزگاریکردن لەکتێب و دەفتەرو کەلوپەلی خوێندن ، ڕێز گرتن لە دایك و باوك و کەسانی لەخۆمان گەورەتر.

پابەندبوون بە یاساو ڕێنماییەکانی هاتووچۆ ، پارێزگاریکردن لە پاکوخاوێنی ماڵ و قوتابخانەو شەقامەکان ، دڵسۆزی بۆنیشتمان و گەل و پارێزگاریکردن لە ژینگە ئەمانەو چەندانی دیکە هەمووی ڕەوشتی جوانـــــــــــی قوتابی دەردەبڕێت.

بەڕەوشتی جوان وڵاتی ئازاد و کۆمەڵی پێشکەوتوو بەرجەستەدەبێت.

**چالاکـــــــــی :**

مامۆستای بەڕێز : داوا لە دەستەیەك لە قوتابییان بکە پەخشنامەیەکی خنجیلانەی سەر دیوار لەبارەی ( خووڕەوشتی جوان ) بۆ پۆلەکەیان دروست بکەن .



پێکەوە یاری کردن

**مامۆستای بەڕێز :**

١.  پرسیار لە قوتابییان بکە کە چۆن کتێبەکانی دەپارێزێت ؟

٢.  داوا لە قوتابییەکان بکە جگە لەم خووڕەوشتانەی کە باسمان کردوون ، چەند خووڕەوشتێکی دیکە دەستنیشان بکات.



ڕەوشتێکی جوانی دیکە ، دەستپاکییە و ئەگەر شتێکی دۆزییەوە یەکسەر دەیگێڕێتەوە بۆخاوەنەکەی ، ئەگەر نەشیزانی هی کێیە ئەوە دەیداتە مامۆستاکەی .

دوای وەرگرتنی مۆڵەت لە دایك و باوکی لە شوێنی تایبەت یاری دەکات ، ناچێت لەکۆڵانان یاری بکات کە دەبێتە هۆی بێزارکردنی دراوسێیەکانی .

# پێرست

بابەت | لاپەڕە

## جوگرافیا



## مێژوو



## هاونیشتمانیبوون